# پەروەردەی منداڵی موسڵمان

## ئاستی یەکەم

ئامادەکردنی

جلیل ابراهیم علی



## له بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەممەد

### ناسنامەی کتێب

ناونیشان: پەروەردەی منداڵی مسوڵمان

ئامادەکردنی: خەلیل ئیبراهیم عەلی

بابەت: پەروەردەی ئیسلامی

دیزاینی بەرگ و دەق: بیلال بەکر سەید غەریب

:پەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

ساڵی چاپ: ٢٠٢٣ میلادی، چاپی یەکەم.

له بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١٨٩١) ساڵی (٢٠٢٢) پێ دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبانە،




**پەیوەندی:** bookadiban@gmail.com - 07731974646 - 07501571818

**ناونیشان:** نووسینگەی سەرەکی: سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان، سەرووی ئامادەیی سلێمانیی کچان، نزیک ناوەندی ڕۆژهەڵاتی کوران.


_ADIBAN



## خاوەنی ئەم کتێبە

ناوی سیانی:..............................................................................

تەمەن:......................................................................................

ژمارەی مۆبایلی سەرپەرشتیار:.........................................................

# یەکەی یەکەم: ناسینی خوای گەورە

## ١ وانەی یەکەم: ئەوەی پێویستە بزانم










**مرۆڤ تەنها بە باوەڕهێنان بەم سیانە خۆشبەختی دونیا و دوارۆژ بە دەست دەهێنێت**

## چالاکی ١

لەگەڵ مامۆستاکەم دەیڵێمەوە




### ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕبکەرەوە:

١- ................................................ پەروەردگارمە.

٢- ................................................ ئاینمە.

٣- ................................................ پێغەمبەرمە.

# ٢ وانەی دووەم: خوا درووستکارە

خوای گەورە منی درووست کردووە و هەموو خەڵکیشی درووست کردووە





خوای گەورە زەوی و ئاسمانەکان و خۆر و مانگی درووست کردووە







## خوای گەورە ئاژەڵ و باڵندەکانی درووست کردووە

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

(اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ) (سورة الزمر: ٦٢ )

واتە: خوا درووستکاری هەموو شتەکانە.

## کەواتە دروستکاری هەموو شتەکان شایستەی پەرستنە بەتەنها

من خوای گەورەم خۆش دەوێت چونکە درووستکار و ڕۆزی دەرمانە.

هەر کەسێك خوای گەورەی خۆش بوێت و گوێڕایەڵی بکات ئەوا خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە.

**ئەم بۆشایانەی خوارەوە پڕبکەرەوە:**

١- ناوی سێ درووستکراوی خوای گەورە بڵێ

.................................. و .................................... و ..................................

# ٣ وانەی سێیەم: خوا ڕۆزی دەرە

## خوای گەورە ڕۆزی دەرمە



## خوای گەورە ڕۆزی دەری هەموو خەڵکیە







## خوای گەورە ڕۆزی دەری ئاژەڵ و باڵندەکانە







چالاکی ١

ئەم ڕستانە ڕەنگ بکە

خوای گەورە ڕۆزی دەرمە




خوای گەورە ڕۆزی دەری ئاژەڵانە




خوای گەورە ڕۆزی دەری باڵندەکانە




# ٤ وانەی چوارەم: خوا بەخشەرە




خوای گەورە نیعمەتی بیستن و بینینی پێ بەخشیوم

خوای گەورە نیعمەتی خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیوم




**نیعمەتی خوا زۆر بەسەرمانەوە بۆیە بەردەوام سوپاسگوزاری دەبم**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

(وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا)

واتە: ئەگەر بتانەوێت نیعمەتەکانی خوا بژمێرن، بۆتان ناژمێردرێن.

# ٥ وانەی: پێنجەم
# خوام خۆش دەوێت

**خوای گەورەم خۆش دەوێت چونکە**

دروستی کردووم

هیدایەتی داوم

ڕۆزی پێ بەخشیوم

نیعمەتی بەسەرمدا ڕشتووە

**خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:**

(وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ).

واتە: موسڵمان خوای لە هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێت.

## چالاکی ١

### ئەم ووشانە تۆخدە کەمەوە

خوای گەورەم خۆش دەوێت چونکە..




### پرسیارەکان

١- بۆچی خوای گەورەمان خۆش دەوێت؟

٢- بەڵگە چییە کە موسڵمان خوای گەورەی زۆر خۆش دەوێت؟

٦ وانەی : شەشەم

# خوا دەپەرستم



## تەنها خوا دەپەرستم



## داوا تەنها لە خوا دەکەم



## نوێژ تەنها بۆ خوا دەکەم

وشەکان دەگەیەنم بە وێنەی گونجاوی:



داوا تەنها لە خوا دەکەم





نوێژ تەنها بۆ خوا دەکەم



# یەکەی دووەم: ناسینی ئاینی ئیسلام

## ١ وانەی یەکەم: ئیسلام ئاینمە



ئیسلام چییە؟



بریتییە لە یەکخواپەرستی و
گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر(ﷺ)
و دوورکەوتنەوە لە شیرك و
موشریکەکان.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

(إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ)

واتە: تەنها ئیسلام ئاینی پەسەند و قەبوڵە لە لای خوا.

چالاکی ١

ئەم ڕستەیە ڕەنگ دەکەم

# ئیسلام ئاینمە

پرسیارەکان

١- ئیسلام چییە؟

٢- بەڵگە چییە کە خوا تەنها بە ئیسلام ڕازییە؟



وانەی دووەم: ٢

# ئیسلام ئایینی ڕاستە

دەسپێک

ئیسلام ئەو ئایینە تەواوەیە کە خوای گەورە پێی ڕازییە و بەڵێنی بەهەشتی پێداوین

**ئیسلام بریتییە لە ئایینی ڕاست و تەواو**

**هەر ئایینێك جگە لە ئیسلام ناڕاست و خراپە**

**تەنها ئیسلام بە ئایینم هەڵدەبژێرم**

خوای پەروەردگار دەفەرموویت:

(وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ)

واتە: هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بە ئایینی خۆی هەڵبژێرێ لێی وەرناگیرێت و لە دوارۆژدا لە زەرەرمەندایە.

چالاکی ١

ئەم ڕستەیە تۆخ دەکەمەوە:

# تەنها ئیسلام ئایینی ڕاست و درووستە

چالاکی خێزانی

**لەگەڵ دایك و باوکم ئەم زیکرە لەبەردەکەم**

يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ، ثَبِّتْ قَلْبِيَ عَلَى دِينِكَ

پرسیارەکان

١- چ ئایینێك ڕاست و درووستە؟

٢- بەڵگە چییە کە خوای گەورە تەنها بە ئایینی ئیسلام ڕازییە؟

# ٣ وانەی سێیەم: پایەکانی ئیسلام ( أركان الإسلام)

دەسپێك

هەموو بینایەك چەند پایەیەکی هەیە کە لەسەری ڕاوەستاوە، ئیسلامیش پێنج پایەی هەیە:



١-شایەتومان بە ووتنی (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ )



٢- نوێژ کردن





٣- زەکات دان

پایەکانی ئیسلام ( أركان الإسلام )



٤- ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان



٥- حەج کردن

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت:**

(ئیسلام بنیات نراوە لەسەر پێنج پایە، شایەتومان بە ووتنی
(أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) نوێژ کردن، وە زەکات دان،
وە ڕۆژووگرتن، وە حەج کردن).

## چالاکی خێزانی

لەگەڵ دایك و باوکم لە ناو هەر پەنجەیەك یەکێك
لە پایەکانی ئیسلام دەنووسین.



چالاکی ١

ئەم ڕستانە تۆخ دەمەوە

١- أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ

٢- نوێژ کردن

٣- زەکات دان

٤- ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان

٥- حەج کردن

پرسیارەکان

١- پایەکانی ئیسلام چەند دانەیە؟

٢- بەڵگە چییە لەسەر پایەکانی ئیسلام؟

# ٤ وانەی چوارەم: ئیسلامم خۆش دەوێت

**دەسپێک**

ئێمەی موسڵمان ئایینی ئیسلامیان خۆش دەوێت چونکە خۆشبەختی تێدا بە دەست دێت.

## ئایینی ئیسلامم خۆش دەوێت

### پایەکانی ئیسلامم خۆش دەوێت



موسڵمان شایەتومان دەهێنێت بە ووتنی (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ)



موسڵمان حەجی ماڵی خوا دەکات



موسڵمان نوێژ دەکات



موسڵمان ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان دەگرێت



موسڵمان زەکات دەدات

## چالاکی ١

یەك بە دوای یەك ژمارە بۆ پایەکانی ئیسلام دابنێ


زەکات دان


نوێژ کردن


حەج کردن


أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ
وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ


ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان

## چالاکی خێزانی

**لەگەڵ دایك و باوکم هەوڵ دەدەم ئەم فەرموودە شیرینە لەبەربکەم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (بُنِيَ الإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ، شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ، وَحَجِّ البَيْتِ)

# یەکەی سێیەم: ناسینی پێغەمبەر ﷺ

## ١ وانەی یەکەم: پێغەمبەرمان محمد ﷺ

### ١ ناو و ڕەچەڵەکی

ناوی محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالمطلب ی کوڕی هاشم، هاشم لە تیرەی قوڕەیشە، قوڕەیشیش لە عەرەبە، عەرەبیش لە نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە ـــ علیهما الصلاة والسلام .

### ٢ لە دایک بوونی

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لە شاری مەککە لە ساڵی فیل لە دایك بووە.

### ٣ سیفاتی

جوانترین ڕەوشتی هەبووە، هەر وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: (وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ)، واتە: محمد ﷺ باشترین ڕەشتت هەیە

## ٤ ناردنی بەپێغەمبەرایەتی ﷺ

کاتێك خوای گەورە سروشی (وەحی) بۆی نارد تەمەنی (٤٠) ساڵ بوو.

(١٣) ساڵ لە شاری مەککە بانگەوازی خەڵکی کرد بۆ یەکخواپەرستی.

## ٥ کۆچ کردنی

پاشان لە شاری مەککەوە کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە

## ٦ کۆچی دوایی

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لەشاری مەدینە لە ڕۆژی دوو شەممە لە دوانزەی ڕەبیع لئەوەل لە ساڵی (١١) ی کۆچی کۆچی دوایی کرد.

## ٢ وانەی دووەم: محمد ﷺ بەندە و نێردراوی خوایە

پێغەمبەرمان ﷺ بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا



خوای گەورە دەفەرموێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ) واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەیە کە ئەم قورئانەی ناردووە بۆ سەر بەندەی خۆی محمد ﷺ.

پێغەمبەرمان ﷺ باشترینی مرۆڤایەتییە

پێغەمبەرمان ﷺ کۆتا پێغەمبەرە

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ) واتە: بەڵکو محمد ﷺ پێغەمبەری خوایە و کۆتا پێغەمبەرە.

### چالاکی خێزانی

لەگەڵ دایك و باوکم ئەم زیکرە لەبەر دەکەین و بەیانیان و ئێواران سێ جار دووبارەی دەکەینەوە.

(رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيًّا)

## پێغەمبەر ﷺ پێشەوامانە

- پێغەمبەرم ﷺ خۆش دەوێت
- باوەڕ دەهێنم بە پەیامی پێغەمبەر ﷺ
- گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ دەکەم و سەرپێچی ناکەم
- هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکات دەچێتە بەهەشتەوە

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

(وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ)

واتە: هەر کەس فەرمانی خوا و پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ بکات خوا دەیخاتە ناو بەهەشتەوە.

## چالاکی ١

**کاتێك گوێم لە ناوی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەڵێم:**

صلی الله علیه وسلم

## چالاکی ٢

**کاتێك گوێم لە ناوی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەڵێم:**

**پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت:** (هەر کەسێك یەك صەڵەواتم لەسەر بدات خوای گەورە دە صەڵاواتی لەسەر دەدات و لە دە تاوانی خۆش دەبێت)

**وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت:** (ڕەزیل ئەو کەسەیە کە ناوی منی لەلادا دەهێنن و صەڵەواتم لەسەر نادات)

**أ** لەگەڵ دایك و باوکم فەرموودەیەکی شیرینی پێغەمبەری خوا ﷺ دەخوێنینەوە و صەڵەواتی لەسەر دەدەین.

**ب** لەسەر پەڕەیەکی دەرەکی دوو پاداشت لەسەر صەڵاواتدان دەنووسم و پیشانی مامۆستای دەدەم.

# وانەی چوارەم: ٤ دەست پاکی و ڕاستگۆیی پێغەمبەرمان (ﷺ)

پێغەمبەرمان (ﷺ) پێش بوونی بەپێغەمبەر ناسرابوو بەڕاستگۆی دەست پاك

**دەست پاکی**

خەڵکی پێغەمبەریان (ﷺ) هەڵدەبژارد بۆ پاراستنی موڵك و شتە گرانبەهاکانیان،

## چالاکی ١

ڕوونی دەکەمەوە کە چۆن بەئەمانەتەوە هەلسوکەوت لەگەڵ ئەمانەی خوارەوەدا بکەم:



- هاوڕێکەم داوای ئەمانەتەکەی کرد کە لێم وەرگرتبوو.



- مامۆستاکەم داوای لێ کردم کە خۆم ئەرکی ماڵەوە جێبەجێ بکەم.

## ڕاستگۆیی پێغەمبەر (ﷺ)

کاتێك خوای پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەرمان (ﷺ) کرد کە بانگەوازی نزیکەکانی بکات بۆ یەکخواپەرستی، سەرکەوتە سەر کێوی صەفا لەشاری مەککە و بانگی خزمەکانی کرد، کاتێك خزمەکانی هاتن، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێکردن و فەرموی: ئەگەر پێتان بڵێم کۆمەڵێك خەڵکی هاتوون لەو دۆڵە هێرش بکاتە سەرتان، بەڕاستم دادەنێن، ووتیان: بەڵێ تائێستا درۆمان لە تۆ نەبینیووە!!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی من ئاگادارکەرەوەی ئێوەم لە سزای توند.

## چالاکی ٢

لەگەڵ هاوڕێکەم گفتوگۆ دەکەین و وەڵامی ڕاست بۆ ئەم هەڵوێستەی خوارەوە دادەنێین



ئەگەر ببمە هۆکاری شکاندنی شوشەیەک، دایکم بپرسێت کێ شکاندوویەتی؟

ڕاستگۆ دەبم و دەڵێم بەڵێ دایە گیان من شکاندوومە.

# ٥ وانەی پێنجەم: سۆز و بەزەیی پێغەمبەر(ﷺ)

## پەیوەست دەبین بەڕەوشتی پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ)

**سۆز و بەزەیی پێغەمبەر (ﷺ)**

عبداللـه ی کـوڕی مەسـعود(ڕەزای خـوای لێبـێ) دەڵێـت: لەگەشـتێکدا لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بوویـن ، بـۆ پێویسـتییەك پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لێـمان جیابوویـەوە، باڵندەیەکـمان بینـی دوو بێچـووی لەگەڵـدا بـوو، ئێمـەش هـەر دوو بێچووەکەمـان بـرد، باڵندەکـە هـات و لەبـەردەم پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) خـۆی دەگوێزانـەوە لەنـاو خۆڵـدا لـە سـۆزی بـۆ بێچووەکانـی، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرمـووی: کـێ ئـازاری ئەمـەی داوە؟، بێچووەکانـی بـۆ بگەڕێننـەوە.

وە هەروەهـا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نوێـژی خێـرا دەکـرد کاتێـك گوێـی لـە گریانـی منداڵێـك ببوایـە وەکـو سـۆزێك بـۆ منداڵ و دایکەکـەی.

## چالاکی خێزانی

لەگـەڵ دایـک و باوکـم باسـی گرنگـی سـۆز و بەزەیـی دەکەیـن لـە میانـەی فێربوونمـان لـە ژیانـی پێغەمبـەری خۆشەویسـتمان(ﷺ).

## هەڵسەنگاندن

### ١ ڕەفتاری گونجاو بۆ ئەم کارانەی خوارەوە هەڵدەبژێرم

- ئەگەر لە قوتابخانە هەندێك پارە لەسەر زەوی کەوت ئەوا:

| هەڵی دەگرم بۆ خۆم و لەلای هیچ کەس باسی ناکەم | هەڵی دەگرم و بەدوای خاوەنەکەی دەگەڕێم | ڕادەستی بەڕێوەبەر یان مامۆستای دەکەم |
|---|---|---|







### ٢ ئەو بازنەیە ڕەنگ دەکەم کە لەگەڵ ئەم بەسەرهاتە دەگونجێت.

- پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێی لە ژنێك بوو کە بەمنداڵە بچووکەکەی ووت: وەرە عبدالله شتێکت پێ بدەم،

پێغەمبەری خوا(ﷺ)پێی فەرموو: دەتەوێت چی پێ بدەیت؟

ژنەکەی ووتی: خورمای پێ دەدەم

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر پێی نەدەیت ئەوا بەدرۆ بۆت دەنووسرێت.

سۆز و بەزەیی

دەست پاکی

ڕاستگۆیی

# یەکەی چوارەم: ناو وسیفاتەکانی خوای پەروەردگار

## ١ وانەی یەکەم: خوا تاك و تەنهایە

### من منداڵی موسڵمانم

لەم وانەیە فێری ئەوە دەبم کە:

١ خوای پەروەردگارمان تاك و تەنهایە و خوای هەموو جیهانیانە.
٢ خوای پەروەردگار تاك و تەنهایە لە ناو و سیفاتەکانی و هاوشێوەی نییە.
٣ خوای پەروەردگار بەتاك و تەنها دەپەرستم و هیچ شەریکێکی بۆ پەیدا ناکەم.

بەڵگەمان ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤))

واتە:

١ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیان بڵێ خوای گەورە تاك و تەنهایە.
٢ هەموو درووستکراوەکان پێویستیان بەو هەیە و خوا پێویستی بەکەس نییە.
٣ کەسی لێ نەبووە و کەسی لێ نابێت.
٤ هیچ کەسێك هاوشێوە و هاوتای ئەو نییە.

## چالاکی خێزانی

لەگەڵ دایک و باوکم سورەتی ئیخلاص دەخوێنینەوە و ناو و سیفاتەکانی خوای گەورە لەم خشتەیەدا دادەنێین.

| ناوی خوای گەورە | سیفاتی خوای گەورە |
| --- | --- |
| | |
| | |
| | |
| | |

### پرسیارەکان

١- کێ بە تاك و تەنها دەپەرستین و شەریك و هاوەڵی بۆ پەیدا ناکەین؟

٢- بەڵگە چییە لەسەر تاك و تەنهای خوای گەورە؟



# ٢ وانەی دووەم: خوا بە ڕەحم و بەزەییە

## خوای گەورە زۆر بە ڕەحم و بە بەزەییە بەرامبەرمان:

١ خـوای گـەورە قورئانـی بـۆ دابەزاندویـن و پێغەمبـەری(ﷺ) بـۆ ڕەوانـە کردوویـن، هـەر وەکـو دەفەرموێـت: (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ)واتـە: ئێمـە تۆمـان بـە ڕەحمـەت ڕەوانـە کـردووە بـۆ هەمـوو خەڵکـی.

٢ خوای گەورە بە جوانترین شێوە درووستی کردووین.

٣ خوای گەورە بارانمان بۆ دەبارێنێت و دانەوێڵەمان بۆ دەڕوێنێت.





## چالاکی خێزانی

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ)،

واتە: خوای گەورە بە ڕەحم و بەزەییە بەرامبەر ئەو کەسانەی بە بەزەیین.

لەگـەڵ دایـك و باوکـم ئـەم فەرمـوودە شـیرینە دەخوێنینـەوە دوو نموونـەی تـر دەنووسـین لەسـەر ڕەحـم و بەزەیـی.

١- یارمەتی کەسێکی کەم ئەندام دەدەم لە کاتێك پێویستی هەیە.

٢- ..............................................................................

٣- ..............................................................................

## چالاکی ١

کۆمەڵەی ( أ) بگەیەنە بە کۆمەڵەی ( ب )

| کۆمەڵەی ( أ ) | کۆمەڵەی ( ب ) |
|---|---|
| ١. باران بارین | بەخشندەیی خوای پەروەردگارە |
| ٢. ناردنی پیغەمبەرﷺ | توڕەبوونی خوای پەروەردگارە |
| ٣. ئازاردانی ئاژەڵ | |
| ٤. دابەزاندنی قورئان | |
| ٥. ڕێزنەگرتن لە بەساڵاچووان | |

### پرسیارەکان

١- کێ بەڕەحمترین بەخشندەکارانە؟

٢- چی دەبێت ئەگەر بە ڕەحم و بەزەیی نەبیت بەرامبەر هاوڕێکانت؟

# ٣ وانەی سێیەم: خوا بیسەر و بینەرە

خوای پەروەردگار بیسەری گوفتارەکانمە و بینەریشمە لە هەموو شوێنێکدا.



١ خوای گەورە بیسەری دوعا و پاڕانەوەکانمە.



٢ خوای گەورە بینەری کردارەکانمە.



٣ خوای گەورە بیسەر و بینەری هەموو شتێکە

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

(لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ)

واتە: هیچ شت و کەسێك لە خوای پەروەردگار ناچێت، و خوای پەروەردگاریش بیسەر و بینەری هەموو شتێکە

## چالاکی ١

| بیسەرمە | بینەرمە |
|---|---|

أ راست دەڵێم چونکە خوا ..............................................................
ب گوێڕایەڵی دایك و باوكم دەكەم چونکە خوا .........................................
ج درۆ ناكەم وخۆم لە درۆ دەگرمەوە چونکە خوا ......................................
د خۆم لە ئازاردانی هاوڕێکانم بەدوور دەگرم چونکە خوا ............................

## چالاکی ٢

نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر ئەو دەستەواژەیە دادەنێم کە خوا خۆشی دەوێت
نیشانەی ( ✗ ) بەرامبەر ئەو دەستەواژەیە دادەنێم کە خوا خۆشی ناوێت.

| دەستەواژەکان | نیشانەکان |
|---|---|
| پێنج نوێژە فەرزەکە ئەنجام دەدەم چونکە خوا دەمبینێت. | |
| زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران دەخوێنم چونکە خوا دەمبیستێت. | |
| ئەگەر کەس نەمبینێت دزی دەکەم. | |
| پارێزگاری لە موڵکی گشتی دەکەم چونکە خوا دەمبینێت. | |
| قسەی نەشیاو دەڵێم ئەگەر کەس گوێی لێم نەبێت. | |

## پرسیارەکان

١ کێ بیسەر و بینەری هەموو شتێکە؟
٢ بیسەر و بینەر دووناوی پەروەردگارن بەڵگەی بۆ دەهێنمەوە.

# یەکەی پێنجەم:عیبادەت کردن و دژەکانی لە هاوەڵبڕیاردان:

## ١ وانەی یەکەم: بۆچی خوا درووستی کردووین؟





خوای پەروەردگار بۆ پەرستنی بەتاك و تەنها درووستی کردووین و شەریك و هاوەڵی بۆ پەیدا ناکەین.

هەر وەکو خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)

واتە: من جنۆکە و مروڤم درووست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە بەتاك و تەنهایی بمپەرستن و ملکەچی فەرمانەکانم بن.

### پرسیارەکان

١. کام لەم ئایەتانە بەڵگەیە لەسەر بەتاك و تەنهایی خوای پەروەردگار و هاوبەش پەیدانەکردن بۆی

- خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ( قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)
- خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)
- خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ)

٢ وانەی دووەم:

# پەرستش و عیبادەت کردن




**عیبادەت**
بریتییە لە هەموو ئەو کردار و گوفتارانەی کە خوای گەورە پێی خۆشە و لێی ڕازییە.

**خـوای گەورە دەفەرموێت:** (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُـدُوا رَبَّكُمُ...)، **واتە: ئەی خەڵکینە عیبادەتی خوای پەروەردگارتان بکەن.**

## چەند نموونەیەك لەسەر عیبادەت کردن


نوێژ کردن


دوعا و پارانەوە


چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك


بەخشین


خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز


حەج کردن

## چالاکی ١

هێڵێك دەکێشم بەژێر ئەو کردەوانەی کە خوا پێی خۆشە،
دوو هێڵ دەکێشم بەژێر ئەو گوفتارانەی کە خوا پێی خۆشە،

سبحان الله وبحمده ، ماچ کردنی دەستی دایك و باوك ، أستغفرالله ، لادانی ئەو شتانەی کە دەبنە ئازار لەسەر ڕێگای خەڵکی

## چالاکی خێزانی

دایک و باوکی بەڕێز: بۆ منداڵەکەت ڕوون بکەرەوە کە بە عیبادەت کردن ڕەزامەندی خوای گەورە و خۆش بەختی دونیا و دوارۆژ بەدەست دێت.

### پرسیارەکان

١ واتای پەرستش و عیبادەت چییە؟

٢ نیشانەی ( ✓ ) دادەنێم بۆ ئەو کردار و گوفتارانەی کە خوا پێی خۆشە،
نیشانەی ( ✗ ) دادەنێم بۆ ئەو کردار و گوفتارانەی کە خوا پێی ناخۆشە.

| | | |
|---|---|---|
| درۆ کردن | چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك | غەش کردن |
| سۆز و بەزەی | ڕاستگۆی | دزی کردن |

**وانەی سێیەم:** ٣

# پەرستش و عیبادەت کردنی خوا بەتاك و تەنها

## خۆش بەختی لە عیبادەت کردنی خوایە بەتاك و تەنها

گەورەترین شتێك کە خوای گەورە فەرمانی پێی کردبێت تەوحید و یەکخواپەرستییە.

ماناکەشی:

بریتییە لە پەرستنی خوای گەورە بە تاك و تەنها.

بەڵگەش لەسەر ئەمە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

(وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ)

واتە ( بێگومان ئێمە بۆ هەموو کۆمەڵە خەڵك و نەتەوەیەك لە شوێنێك ژیابێتن پێغەمبەرێکمان بۆ ڕەوانە کردوون، بۆ ئەوەی خوا بەتاك و تەنها بپەرستن و دوور بکەونەوە لە هەموو پەرستراوێك جگە لەخوا.



## چالاکی ١



خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ)

واتە: بێگومان پێغەمبەر نوحمان ﷺ بۆ لای قەومەکەی ڕەوانەکردووە، ئەویش پێی ووتن ئەی قەومەکەم خوا بەتاك و تەنها بپەرستن و هاوەڵ و شەریکی بۆ پەیدا مەکەن.

لەگەڵ هاوڕێکانم ئەو ئایەتە پیرۆزە دەخوێنینەوە و ئەو بڕگەیە دەردەهێنین کە ئاماژەیە بە یەکخواپەرستی

## چالاکی ٢

لەگەڵ هاوڕێکانم ئەم ووشانە ڕێك دەخەین و ڕستەیەکی بەسوودی لێ دروست دەکەین پاشان دەیخوێنینەوە.

بە تەنها ــ دەپەرستین ــ خوای گەورە

.................................................................................................

بەهەشت ــ دەمان گەیەنێت بە ــ یەکخواپەرستی

.................................................................................................

## چالاکی ٣

لەخشتەی پیتەکان ناوی ئەو عیبادەتانە دەردەهێنم پاشان لە ژێر ئەو وێنانە دەینووسمەوە کە گونجاوە.

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ن | و | يـ | ژ | ط | ث |
| ب | ه | خ | ش | يـ | ن |
| د | و | عـ | ا | ء | ف |
| ح | ه | ج | ض | ك | ل |


..................


..................


..................


..................

### پرسیارەکان

١ ئەم بۆشایە پڕبکەرەوە:
گەورەترین شـــتێک کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردبێت بریتییە لە
..............................................................

٢ واتای یەکخواپەرستی چییە؟

## ٤ وانەی چوارەم: پەرستنی جگە لە خوای پەروەردگار شیرك و هاوەڵبڕیاردانە

**ئەگەر زانیمان یەکتاپەرستی گەورەترین فەرمانی خوایە ئەی گەورەترین قەدەغەکراوی خوا چییە؟**

گەورەترین قەدەغەکراوی خوای گەورە شیرك و هاوەڵبڕیاردانە: ← **شیرك** ← بریتییە لەوەی مرۆڤ لەگەڵ خوای گەورە کەسێکی تر بپەرستێت.

# من خوای پەروەردگار بەتاك و تەنها دەپەرستم







## نموونە لەسەر شیرك و هاوەڵبڕیاردان

سوجدە بردن بۆ جگە لە خوا

دوعا و پاڕانەوە لە مردوان

## چالاکی ١

بەهاوکاری لەگەڵ هاوڕێکانم ئەوەی تەوحید و یەکخواپەرستی بێت لەسەر دارەکە دەینووسینەوە



أ سوجدە بردن بۆ خوای پەروەردگار
ب دوعا و پاڕانەوە لە مردوان
ج رکوع بردن بۆ پەیکەر
د رکوع بردن بۆ خوای پەروەردگار
هـ خۆش ویستنی خوای پەروەردگار

### پرسیارەکان

١ گەورەترین شتێك کە خوای گەورە قەدەغەی کردبێت چییە؟
٢ شیرك و هاوەڵبڕیاردان چییە؟

# بەشی دووەم
# فیقهو ئاداب

یەکەی یەکەم: بە گەورە ڕاگرتنی قورئان.
یەکەی دووەم: پاکو خاوێنی (الطهارة).
یەکەی سێیەم: دەست نوێژ.
یەکەی چوارەم: نوێژ.
یەکەی پێنجەم: سڵاوکردن.
یەکەی شەشەم: چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك.
یەکەی حەوتەم: مافی مامۆستا.
یەکەی هەشتەم: هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی.

# یەکەی یەکەم:
# بەگەورە ڕاگرتنی قورئانی پیرۆز

وانەی یەکەم: ١

## خۆشویستنی قورئانی پیرۆز و پەناگرتن و (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) کردن

### قورئانی پیرۆز بەگەورە ڕادەگرین و خۆشمان دەوێت

قورئانی پیرۆزم خۆش دەوێت چونکە:

وتەی خوای پەروەردگارە.

چاکەی پێ زیاد دەبێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: ( هەر کەسێك پیتێك لە قورئانی پیرۆز بخوێنێت ئەوا چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، چاکەش بە دە قاتە).



گوێ دەگرم و بێ دەنگ
دەبم بۆ قورئانی پیرۆز

گاڵتە و گەپ و
قسە ناکەم لە کاتی
قورئان خوێندندا.



## چالاکی ١



ئەم وێنەیە ڕەنگ دەکەم پاشان
خۆش ویستن بۆ قورئان دەردەبڕم



## چالاکی خێزانی

دایک و باوکی بەڕێز: داوا لە منداڵەکەت بکە کە جیاوازی لە نێوان قورئان و
کتێبەکانی تر بکات

# پەناگرتن و (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لە کاتی قورئان خوێندن

لە کاتی قورئان خوێندن پەنادەگرم و دەڵێم (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)

لەسەرەتای سورەت دەڵێم: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

## چالاکی ٢

کاتێک سورەتی ئیخلاص دەخوێنمەوە پەنادەگرم و (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) دەخوێنم.


سُورَةُ الإِخْلَاصِ
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ١ اللَّهُ الصَّمَدُ ٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ٣
وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ٤



(أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

پەیوەست دەبم بەپەناگرتن و (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) کردن لە کاتی قورئان خوێندن

**قورئانی پیرۆز ووتەی خوای پەروەردگارە بۆیە:**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| بەدەست نوێژەوە دەیخوێنمەوە. | هیچ شتێك لەسەری دانانێم. | هیچ شتێکی لەسەر نانووسم و وێنەی لەسەر ناکێشم. | لەسەری دانانیشم و نایکەمە سەرین. | لەئاستیدا قاچ درێژ ناکەم. |

## وانەی دووەم: ٢

# گرنگی دان بەقورئان

## گرنگی بەقورئانی پیرۆز دەدەین چونکە خۆشمان دەوێت

قورئانی پیرۆز نووسراوە لە موصحەف

لە شوێنێکی گونجاو دایدەنێم







پارێزگاری لە قورئانی پیرۆز دەکەم



## چالاکی ١

بەسەرپەرشتی مامۆستاکەم و بەهاوکاری لەگەڵ هاوڕێکانم هەڵدەسین بەپاك ڕاگرتنی قورئانی پیرۆز و دانانی لە شوێنێکی گونجاو، پاشان گرنگی ئەم کارەمان لەگەڵ مامۆستا تاوتوێ دەکەین.

### هەڵسەنگاندن

١ ڕەنگی سەوز بۆ وێنەی گونجاو دادەنێم
ڕەنگی سور بۆ وێنەی نەگونجاو دادەنێم










## ٢ ئەو ووشانەی کە بەکاڵی نووسراون تۆخ دەکەمەوە:

- من قورئانی پیرۆزم خۆش دەوێت
- من هەموو ڕۆژێك قورئانی پیرۆز دەخوێنمەوە





## ٣ براکەم لە نێو کتێبەکانی چەند پەڕەیەکی قورئانی بینی.

- یارمەتی براکەم دەدەم لە هەڵبژاردنی ڕێگایەکی گونجاو بۆ پاراستنی ئەو پەڕانە

دانانی نیشانەی ( ✓ ) بۆ ڕێگای گونجاو
دانانی نیشانەی ( ✗ ) بۆ ڕێگای نەگونجاو







## ٤ ڕەنگ دەکەم

سوپاس بۆ خوا فێربووم چۆن قورئان بەپیرۆز ڕابگرم

## ٥ ئەم چیرۆکە دەخوێنمەوە

◂ بۆ هەر وێنەیەك لەم وێنانەی خوارەوە وشەیەكی گونجاو دەردەبڕم، پاشان چیرۆکەکە بەتەواوی دەخوێنمەوە.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئازاد لەگەڵ باوکی | ڕۆشت بۆ |  | لەسەر زەوی |  |
| بینی | ئازاد |  | هەڵگرت و بەهێمنی |  |
| دانا | ئازاد لەتەنیشت باوکی | بەئەدەبەوە دانیشت و |  | دەگرت لە خوێندنەوەی |
|  | باوکی | | | |

# یەکەی دووەم: پاکو خاوێنی ( الطهارة )

وانەی یەکەم: ١

## پاکو خاوێنی ( الطهارة )

دەسپێك

ئیسلام ئاینی پاکو خاوێنییە کە گرنگییەکی زۆر دەدات بە خاوێنی لاشە و دەروونمان

## خوای گەورە پاکوخاوێنی لەسەرمان واجب کردووە

هەر وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ)
واتە: جلوبەرگەکەت پاك ڕابگرە

چالاکی ١

وەڵامی گونجاو ڕەنگ بکە

پاکوخاوێنی پێش دەست نوێژ:

واجبە سوننەتە

## له پاکو خاوێنی

### دەست نوێژ

پێویسته پێش نوێژ دەست نوێژ بگرین



### لابردنی پیسی

به ئاو له :

- لاشه
- جلوبەرگ
- شوێنی نوێژ







## چالاکی ٢

### ڕەنگ دەکەم

من موسڵمانم گرنگی به پاکوخاوێنی لاشه و جلوبەرگ و شوێنی نوێژەکەم دەدەم

# ٢ وانەی دووەم: زیکری چوونە سەرئاو و دەرچوون لێی:

## ئیسلام ئاینی پاك و خاوێنییە

ئیسلام فێری ئادابەکانی دەست بەئاو گەیاندنمان دەکات





پێش چوونە سەر ئاو دەڵێم : (بِسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ) پاشان قاچی چەپم پێش دەخەم



پاش تەواو بوون بەقاچی ڕاست دەردەچم پاشان دەڵێم :(غُفْرَانَكَ)

## چالاکی ١

بە سەرپەرشتی مامۆستاکەم لەگەڵ هاورێکانم زیکرەکانی چوونە سەرئاو و دەرچوون لێی لەبەر دەکەین و لەگەڵ یەکتر دووبارەی دەکەینەوە

# ٣ وانەی سێیەم: لە ئادابەکانی سەرئاو کردن

پاش دەست بەئاوگەیاندن ئەم ئادابانە جێبەجێ دەکەم:

١ دەستی چەپ بەکاردەهێنم بۆ خۆپاککردنەوە.

٢ پاککردنەوەی پێش و پاش بە ئاو، ئەگەر ئاو بەردەست نەبوو بە کلێنس یان بەرد خۆم پاك دەکەمەوە.





٣. پاش دەست بەئاوگەیاندن شوێنی خۆم پاك دەکەمەوە.



٤. بەجوانی دەستەکانم بەئاو و صابوون دەشۆم.



**پاك و خاوێنی بەشێکە لە جوانییەکانی ئیسلام**

# یەکەی سێیەم: دەست نوێژ

## ١ وانەی یەکەم: گرنگی و فەزڵی دەست نوێژ

دەسپێك

دەست نوێژ عیبادەتێکی گرنگ و گەورەیە

ئاینەکەمان زۆر گرنگی و بایەخ دەدات بەدەست نوێژ کە چەندین فەزڵ و چاکەی تێدایە.



**یەکەم:** دەست نوێژ مەرجە بۆ دروستێتی نوێژ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ( نوێژی کەسێکتان درووست نییە کە دەست نوێژەکەی شکا تاوەکو دەست نوێژ نەگرێتەوە ).



دووەم: دەست نوێژ هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: ( هەر کەسێك بە جوانی دەست نوێژ بگرێت ئەوا تاوانەکانی لە جەستەیەوە دەست بە دەرچوون دەکەن تاوەکو لە ژێر نینۆکەکانی دەردەچێت ).

## چالاکی ١

وەڵامی ڕاست بخەرە ناو بازنەوە

پێویستە دەست نوێژ بگرین پێش:

خواردن - سەفەر کردن - نوێژ

## چالاکی خێزانی

دایك و باوکی بەڕێز: باسی گەورەیی ئەم ئایینە بکە بۆ منداڵەکەت چەند گرنگی بە پاکوخاوێنی دەدات کە دەبێتە هۆی ڕەزامەندی خوای گەورە.

# ٢ وانەی دووەم: فەرزەکانی دەست نوێژ

دەسپێك

دەست نوێژ عیبادەتێکی گرنگ و گەورەیە، هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێت: ( هیچ کەسێك گرنگی بە دەست نوێژ نادات تەنها موسڵمان نەبێت ).

## چالاکی ١

کام لەو وێنانە گوزارشت دەکەن لەسەر دەست نوێژ

وێنەی ژمارە (        )

١



٢



خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

(إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ).

واتە: خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە تەوبە دەکەن و پاکوخاوێنی ڕادەگرن.

لەم ئایەتە دوو کومەڵە هەن خوای گەورە خۆشی دەوێت:

أ تەوبەکاران.      ب ..................................

# فەرزەكانی دەست نوێژ

ووتنی ( بسم الله ) پێش دەست نوێژ.

١

شۆردنی ڕوخسار و ئاو هەڵدانە دەم و لوت.







٢

شۆردنی دەست لەگەڵ ئانیشك





## ٣

### مەسحی هەموو سەر لەگەڵ گوێ







## ٤

### شۆردنی پێ لەگەڵ قولەپێکان



من ئاو زۆر بەکارناهێنم

ئاینی پیرۆزی ئیسلام پەروەردەمان دەکات لەسەر بەفیڕۆنەدانی ئاو و هەموو شتێکیش

## ٥

### ڕیزبەندی شۆردنی ئەندامەکان

شۆردنی ڕوخسار، پاشان دەست لەگەڵ ئانیشك، پاشان مەسحی هەموو سەر لەگەڵ گوێ، پاشان شۆردنی پێ لەگەڵ قولەپێکان، هیچ کامیان پێش ئەوی تریان نەخەین.

## ٦

### بەدوایەکداهاتن

شۆردنی هەموو ئەندامەکان بەدوای یەکدا و ڕاستەخۆ، نابێت دوابخرێت بە شێوازێك ئەندامەکەی پێشووی ووشك ببێتەوە.

**بە وازهێنان و نەکردنی یەکێك لەم فەرزانە دەست نوێژەکە درووست نابێت**

## چالاکی ١

**کاتێك دەست نوێژەکەم بەتەواوی گرت پاشان ئەم زیکرەیە دەخوێنم:**

(أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ)

## چالاکی خێزانی

**بە هاوکاری لەگەڵ دایك و باوکم فەرزەکانی دەست نوێژ دەنووسین لە لاپەڕەیەکی دەرەکی پاشان پیشانی مامۆستای دەدەم.**

# ٣ وانەی سێیەم: بەتاڵکەرەوەکانی دەست نوێژ

**دەسپێك**

دەست نوێژ عیبادەتێکی گرنگ و گەورەیە، هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرمووێت: ( هیچ کەسێك گرنگی بە دەست نوێژ نادات تەنها موسڵمان نەبێت ).

ئەنەس دەست نوێژی گرت  پاشان خەوت  کاتێك هەستا بۆ نوێژی بەیانی دایکی پێی ووت دەست نوێژ بگرە.

ئاری دەست نوێژی گرت بۆ نوێژی نیوەڕۆ  پاشان چووە سەر ئاو  مامۆستا پێی ووت دەست نوێژ بگرەوە.

ئەحمەد دەست نوێژی گرت  پاشان گۆشتی ووشتری خوارد  پاشان وویستی نوێژی عەسر بکات باوکی پێی ووت دەست نوێژ بگرە

## چالاکی ١

ئەو هۆکارانە چین بوون کە وای کرد لە هەر یەك لە ئەنەس و ئاری و ئەحمەد دەست نوێژ بگرنەوە؟

١ ..............................................................................

٢ ..............................................................................

٣ ..............................................................................

# بەتاڵکەرەوەکانی دەست نوێژ

دەست نوێژ بەتاڵ دەبێتەوە بەم سێ هۆکارە:

١. ئەوەی لە پێش و پاشەوە دەردەچێت
- میز
- پیسی
- دەنگ و بۆن

٢. خەوتن

٣. خواردنی گۆشتی ووشتر





کاتێك دەست نوێژەکەم بەتاڵ بوویەوە بەو سێ هۆکارە پێویستە دەست نوێژ بگرمەوە ئەگەر وویستم نوێژ بکەم.

# یەکەی چوارەم : نوێژ

## ١ وانەی یەکەم: گرنگی و پێگەی نوێژ

دەسپێك



نوێژ هۆکاری سەرفەرازی و خۆش بەختییە لە دونیا و دوارۆژدا.

### نوێژ گرنگی و پایەیەکی گەورەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە:



١ نوێژ پایەی دووەمە لە پایەکانی ئیسلام

پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرمووێت:
(ئیسلام بنیات نراوە لەسەر پێنج پایە، شایەتومان بە ووتنی (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) نوێژ کردن، وە زەکات دان، وە ڕۆژووگرتن، وە حەج کردن).

چالاکی ١

ئەم بۆشایە پڕبکەرەوە

نوێژ پایەی ................................ لە پایەکانی ئیسلام.



## ٢ نوێژ یەکەم لێپرسینەوەی لەسەرە لە ڕۆژی دوایدا.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموویت: (یەکەم شتێك کە بەندە لە ڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت نوێژەکانێتی، ئەگەر نوێژەکەی باش بێت ئەوا ئەوانی تریش باش دەبێت، وە ئەگەر نوێژەکەی خراپ بێت ئەوا دۆڕا و سەرگەردان دەبێت ).

## چالاکی ١

**وەڵامی ڕاست ڕەنگ بکە:**

یەکەم شت بەندە لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا:

ڕۆژوو      زەکات      نوێژ

## چالاکی خێزانی

لەگەڵ دایك و باوکم ئەم ڕستەیە بە گەورەیی دەنووسین پاشان پیشانی مامۆستای دەدەم.

( نوێژ هۆکاری چوونە بەهەشتە )

## ٢ وانەی دووەم: نوێژە فەرزەکان

دەسپێك

لە شەو و ڕۆژێکدا چەند جار گوێمان لە بانگ دەبێت



## نوێژ پایەی دووەمە لە پایەکانی ئیسلام

من گرنگی بە نوێژەکانم دەدەم و بە جوانی ئەنجامی دەدەم چونکە گوێڕایەڵی خوای گەورە و پێغەمبەری خوای (ﷺ) تێدایە.

له شەو و ڕۆژێکدا **پێنج نوێژ** فەرزە لەسەرمان ئەنجامی بدەین ئەوانیش:
















## چالاکی ١

نوێژەکان دەناسمەوە بە پێی ژمارەی ڕکاتەکان

| نوێژە دوو ڕکاتەکە | نوێژە ٣ ڕکاتەکە | نوێژە ٤ ڕکاتەکان |
|---|---|---|
| نوێژ................. | نوێژی ................... | نوێژی ................... |
| | | نوێژی ................... |
| | | نوێژی ................... |

**گرنگی بە نوێژەکان دەدەم چونکە هۆکاری چوونە بەهەشتە.**

# ٣ وانەی سێیەم: چۆنێتی نوێژ

**دەسپێك**

هەموو موسڵمانانی سەر گۆی زەوی یەك قیبلەمان هەیە کە لە نوێژەکاندا ڕووی تێدەکەین ئەویش کەعبەی پیرۆزە.




پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دەفەرمووێت: (من چۆن نوێژ دەکەم ئێوەش بەو شێوەیە نوێژ بکەن).

## ڕکاتی یەکەم



١ ڕووکردنە قیبلە



٢ تەکبیرەی ئیحرام، هەر دوو دەست بەرزدەکەینەوە و دەڵێین: (اللَّهُ أَكْبَرُ)



٣ پاشان دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ دادەنێین.

٤ پاشان دوعای دەستپێکردنی نوێژ دەخوێنین: (اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا).



سُورَةُ الفَاتِحَةِ ١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحْمَٰنِ
ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ٤
إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ٥
ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ
ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ
عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧

وَآيَاتُهَا سَبْعٌ

٥ پاشان سوڕەتی (فاتیحە) دەخوێنین و سوڕەتێکی تر یان چەند ئایەتێك دەخوێنین.



٦ پاشان ( اللَّهُ أَكْبَرُ ) دەکەین و دەچینە ڕکوع، لە ڕکوع سێ جار دەڵێین: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ).



٧ لە کاتی بەرز بوونەوە لە ڕکوع دەڵێین: ( سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ )، پاشان ڕاست بووینەوە دەڵێین: ( رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ ).



٨ پاشان دەڵێین ( اللَّهُ أَكْبَرُ ) و دەچینە سوجدە، لە سوجدە سێ جار دەڵێین ( سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى ).



دەڵێین ( اللَّهُ أَكْبَرُ ) لە سوجدە بەرز
ە، لە دانیشتنی نێوان سوجدەکان
و جار دەڵێین ( رَبِّ اغْفِرْ لِي ).



دەڵێین ( اللَّهُ أَكْبَرُ ) و سوجدەی دووەم
سێ جار دەڵێین: ( سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى ) .

ی کرداری

بە چاودێری مامۆستاکەم چۆنێتی نوێژ ئەنجام دەدەم.

## هەڵسەنگاندن

**١ گونجاوی ( أ ) بگەیەنە بە گونجاوی ( ب )**

### أ



لە سوجدە دەڵێم:



لە ڕکوع دەڵێم:



لە نێوان سوجدەکان دەڵێم:



لە کاتی هەستانەوە لە ڕکوع دەڵێم:

### ب

سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ

سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى

سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ

اللّٰهُ أَكْبَرُ

رَبِّ اغْفِرْ لِي

٤ وانەی چوارەم: **ڕکاتی دووەم**

## هەستانەوە بۆ ڕکاتی دووەم



١ هەر دوو دەست بەرزدەکەینەوە و دەڵێین: (اللهُ أَكْبَرُ)



٢ پاشان دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ دادەنێین.




٣ پاشان سورەتی (فاتیحە) دەخوێنین و سورەتێکی تر یان چەند ئایەتێک دەخوێنین.



٤ پاشان (اللهُ أَكْبَرُ) دەکەین و دەچینە ڕکوع، لە ڕکوع سێ جار دەڵێین: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ).



٥ لە کاتی بەرز بوونەوە لە ڕکوع دەڵێین: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، پاشان ڕاست بووینەوە دەڵێین: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ).



٦ پاشان دەڵێین (اللهُ أكبَر) و دەچینە سوجدە، لە سوجدە سێ جار دەڵێین (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى).



٧ پاشان دەڵێین (اللهُ أكبَر) لە سوجدە بەرز دەبینەوە، لە دانیشتنی نێوان سوجدەکان دوو جار دەڵێین (رَبِّ اغْفِرْ لِي).



٨ پاشان دەڵێین (اللهُ أكبَر) و سوجدەی دووەم دەبەین و سێ جار دەڵێین (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى).



٩ پاشان لە سوجدە بەرز دەبینەوە و دەڵێین (اللهُ أكبَر) تەحیاتی یەکەم دەخوێنین: (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).

# ٥ وانەی پێنجەم: ڕکاتی سێیەم و چوارەم

دەسپێک

لەگەڵ هاوڕێکانم بەراورد دەکەین لە نێوان ڕکاتی یەکەم و ڕکاتی دووەم.



١ هەڵدەسینەوە بۆ ڕکاتی سێیەم و دەڵێین (اللّهُ أكبَرُ)



٢ پاشان دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ دادەنێین.




٣ پاشان تەنها سورەتی ( فاتیحە ) دەخوێنین.



٤
پاشان ( اللَّهُ أَكْبَرُ ) دەکەین و دەچینە ڕکوع،
لە ڕکوع سێ جار دەڵێین:
( سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ ).



٥
لە کاتی بەرز بوونەوە لە ڕکوع دەڵێین:
( سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ )، پاشان ڕاست بووینەوە
دەڵێین: ( رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ ).



٦
پاشان دەڵێین ( اللَّهُ أَكْبَرُ ) و دەچینە سوجدە،
لە سوجدە سێ جار دەڵێین
( سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى ).



٧
پاشان دەڵێین ( اللَّهُ أَكْبَرُ ) لە سوجدە بەرز
دەبینەوە، لە دانیشتنی نێوان سوجدەکان
دوو جار دەڵێین ( رَبِّ اغْفِرْ لِي ).



٨ پاشان دەڵێین ( اللهُ أكبَرُ ) و سوجدەی دووەم دەبەین.



٩ پاشان لە سوجدە بەرز دەبینەوە و دەڵێین ( اللهُ أكبَرُ ) کاتێك دادەنیشین بۆ ڕکاتی کۆتایی تەحیاتی دووەم دەخوێنین و صەڵەوات دەدەین لەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) .

## لەبەری دەکەم

التَّحيَّاتُ للَّه وَالصَّلَوَاتُ
وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ
وَرَحْمَةُ اللَّه وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَاد
اللَّه الصَّالحينَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنْ
مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ،
اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّد وَعَلَى آل مُحَمَّد كَمَا صَلَّيْتَ
عَلَى آل إبْرَاهيمَ إِنَّكَ حَميدٌ مَجيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ على
مُحَمَّد وَعَلَى آل مُحَمَّد كَمَا بَارَكْتَ عَلَى
آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَميدٌ مَجِيد





١ به لای ڕاست سەلام دەدەینەوە و دەڵێین:
(السَّلامُ عَلَيكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ).
پاشان بە لای چەپ سەلام دەدەینەوە و
دەڵێین: (السَّلامُ عَلَيكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ).

## چالاکی کرداری

بە چاودێری مامۆستاکەم و لە پێش چاوی هاوڕێکانم چۆنێتی نوێژ ئەنجام دەدەم

# گرنگی بە نوێژەکانم دەدەم لە مزگەوت

# ٦ وانەی شەشەم: بەتاڵکەرەوەکانی نوێژ



١ نوێژ بەتاڵ دەبێتەوە بە بەتاڵکەرەوەکانی دەست نوێژ ( میز یان پیسی یان دەنگ و بۆن ).



٢ خواردن و خواردنەوە.



٣ قسەکردن.



٤ پێکەنین



٥ جوڵەی زۆر

# یەکەی پێنجەم: سڵاو کردن

## ١ وانەی یەکەم: دەست پێکردنی سڵاو



السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ
وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ

مامۆستا بە خوێندکارەکانی ووت:

ئایا ڕێگایەکتان فێربکەم کە

چاکەی پێ زیاد بکات و خۆشەویستی خەڵك بەدەسبهێنن؟

قوتابیان ووتیان :

بەڵی مامۆستا

مامۆستا:

ئەویش سڵاوی ئیسلامە بەکەسێك گەشتن دەڵێین

السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ

ئەحمەد ووتی:

ئایا سڵاو لە کەسێك بکەین کە نایناسین؟

مامۆستا:

بەڵێ، سەلام لە کەسێك دەکەین کە دەیناسین و لە کەسێکیش کە نایناسین.

((السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ)) بریتییە لە سڵاوی ئیسلام

## چالاکی ١

### گوێ لە مامۆستاکەم دەگرم کاتێك ئەم فەرموودەیە دەخوێنێتەوە پاشان وەڵام دەدەمەوە

هاوەڵی خۆشەویست عیمرانی کوڕی حوصەین(ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ووتی: السلام علیکم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: دە چاکە، پیاوێکی تر هات ووتی: السلام علیکم ورحمە اللە ، پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی: بیست چاکە، پیاوێکی تر هات و ووتی: السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتە، پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی: سی چاکەی بۆ دەنووسرێت.

### هەڵسەنگاندن



١ خێری هەر یەك لەم شێوازانەی سڵاوکردن بەهێڵێك دەگەیەنم بەو پاداشتەی بۆی نوسراوە لەبەرامبەریدا:

| | |
|---|---|
| • السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ | ٢٠ چاکە |
| • السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ | ٣٠ چاکە |
| • السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ | ١٠ چاکە |

# ٢ وانەی دووەم: وەڵامدانەوەی سڵاو

ئازاد پرسیاری لە مامۆستا کرد:

چۆن وەڵامی کەسێك بدەینەوە کە سڵاوی لێ کردین؟

مامۆستا ووتی:

لە بیرتە چۆن سڵاو دەکەین کاتێك بگەیت بەکەسێك؟

ئازاد ووتی:

بەڵێ، کاتێك بگەم بەکەسێك دەڵێم:

السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ

مامۆستا ووتی:

ئافەرین ئازاد، وەڵام دانەوەش بریتییە لە:

وَعَلَيْكُمُ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ

ئازاد ووتی:

زۆر سوپاس مامۆستای دڵسۆز.



## چالاکی ١

خوای پەروەردگار دەفەرموویت: (وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا)واتە: ئەگەر سڵاوتان لێکرا ئەوا ئێوە بەجوانترین شێوە وەڵامی سەلامەکە بدەنەوە.

بەسەرپەرشتی مامۆستاکەم: بەهاوکاری هاوڕێکانم شێوازەکانی سڵاو کردن و وەڵامدانەوە جێبەجێ دەکەین.

# سڵاوکردن دوعاکردنە بەئاشتی و سەلامەت

## هەڵسەنگاندن

**١ جوانترین شێوازی سڵاوکردن ڕەنگ دەکەم**

السلام عليكم ورحمة الله

السلام عليكم

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

## ٢ نیشانەی ( ✓ ) یان ( ✗ ) بۆ ئەمانەی خوارەوە دادەنێم

(أ) خۆشحاڵ بووم کاتێك براکەم هاتەوە ماڵەوە و ووتی:



حاڵت چونە
دایکە گیان



السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ حاڵت
چۆنە دایکە گیان

(ب) کاتێك هاوڕێکەم هاتە ژوورەوە:



ڕاستەوخۆ لەشوێنی
خۆی دانیشت



ووتی : السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ پاشان
لە شوێنی خۆی دانیشت

(ج) براکەم تەلەفۆنی بۆ ئاری هاوڕێی کرد، ووتی:



ئاری لە کوێیە



السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ ئاری لە کوێیە

# یەکەی شەشەم: چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك

## ١ وانەی یەکەم: فەرمان کردن بەچاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك

خێزانی خۆشەویست

دایک و باوکی بەڕێز: لەم وانەیە منداڵەکەت فێری مافەکانی دایک و باوک دەکرێت، وە فێری ئەو شێواز و ڕێگایانە دەبێت بۆ چاکە کردن و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی دایک و باوک، وە پێویستە ئەم مافانە لە ماڵەوە جێ بەجێ بکات.

چالاکی کرداری

لە کاتی گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە دەستی دایک و باوکم ماچ دەکەم.



# چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك ڕێگەی چوونە بەهەشتە

## خوای پەروەردگار فەرمانی ئەوەی پێ کردووین:

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:
(وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا)
واتە: پەروەردگارت فەرمانی کردووە و بڕیاری داوە کە هیچ کەسێك نەپەرستن جگە لە الله وە هەروەها فەرمانی کردووە لەگەڵ دایك و باوکتان چاکە کاربن.

## پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرمانی پێ کردووین:

عبدالله ی کوڕی مەسعود (ﷺ) دەفەرمووێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باشترین کاروکردەوە چییە؟ ئەویش فەرمووی: نوێژ کردنە لە کاتی خۆیدا: ووتم: پاشان، فەرمووی: چاکە کردنە لەگەڵ دایك و باوك.

## چالاکی ١

**ئەم ئایەتە پیرۆزە لەبەردەکەم**

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: (وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا)

چاکە لەگەڵ دایك و باوکم دەکەم چونکە بەهۆیەوە دەڕۆمە بەهەشتەوە

هەموومان دەمانەوێت ئەم ڕێگەیە بگرینەبەر بۆ ئەوەی بەهەشت بەدەست بهێنین

# ٢ وانەی دووەم: چۆن چاك بین لەگەڵ دایك و باوك

## چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك گوفتار و کردارە

کارزان پرسیاری لە مامۆستا کرد:

مامۆستا چۆن چاکە بکەین لەگەڵ دایك و باوك؟

مامۆستا ووتی:

چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك بەزۆر شت دەبێت، لەوانەش:

گوێڕایەڵیان دەکەم و دەنگ بەسەریان بەرزناکەمەوە

دەڵێم: بەڵێ دایە گیان بەڵێ باوە گیان

کاتێك دەمەوێت بچمە ژوورەکەیان مۆڵەتیان لێ وەردەگرم



سڵاویان لێ دەکەم بە ووتنی

السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ

لە ڕێگاوبان پێشیان ناکەوم



دوعایان بۆ دەکەم

خوایە گیان دایك و باوکم بپارێزی

یارمەتیان دەدەم



## چالاکی ١

لە پەڕاوێکی دەرەکی باسی خۆشەویستی دایک و باوکم دەکەم، پاشان پیشانی مامۆستای دەدەم.

## چالاکی خێزانی

دایک و باوکی بەڕێز: داوا لە منداڵەکەت بکە هەستێت بەئەنجامدانی مۆڵەت وەرگرتن لە کاتی هاتنە ژوورەوە بۆ لاتان.

## هەڵسەنگاندن

### ١ نیشانەی ( ✓ ) بۆ هەڵسوکەوتی جوان دادەنێم.

أ هاوڕێکەم پەیوەندی بە باوکی کرد و ووتی:

- ◯ باوکە ڕۆژێکی خۆشم لە قوتابخانە بەسەر برد



- ◯ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله وَبَرَكَاتُهُ باوکە گیان ڕۆژێکی خۆشم لە قوتابخانە بەسەر برد

ب براکەم لەگەڵ دایکم قسەی کرد:

- ◯ بەنەرم و نیانی قسەی دەکرد



- ◯ بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد

ج براکەم کاتێك ویستی بچێت بۆ ژووری دایك و باوکم

- ◯ ڕاستەوخۆ ڕۆشتە ژوورەوە



- ◯ مۆڵەتی وەرگرت پاشان ڕۆشتە ژوورەوە

### ٢ دەخوێنمەوە و ڕەنگ دەکەم

دایك و باوکم خۆش دەوێت و گوێڕایەڵیان دەکەم دوعای خێریشیان بۆ دەکەم

# یەکەی حەوتەم: مافی مامۆستا

## وانەی یەکەم: ١ ڕێزگرتن لە مامۆستا

**مامۆستا فێری زانست و زانیاری و ئاکاری جوانمان دەکات.**



خۆم فێری مافی مامۆستا دەکەم

سڵاوی لێ دەکەم

بەئەدەبەوە قسەی لەگەڵ دەکەم

لەکاتی قسەکردندا قسەی پێ نابڕم

دوعای خێری بۆ دەکەم

گوێ بۆ قسەکانی دەگرم

مۆڵەتی لێ وەردەگرم لە کاتی چوونە ژوورەوە و ڕۆشتنە دەرەوە

### چالاکی ١

لە پەڕاوێکی دەرەکی سوپاس و پێزانینی خۆم بۆ مامۆستاکەم دەردەبڕم

## ٢ وانەی دووەم: جێ بەجێ کردنی داواکاری مامۆستا

## ڕێزی مامۆستا دەگرم و هاوکاری دەبم



گرنگی بە کتێب و دەفتەرەکانم دەدەم.



گرنگی بەئەرکەکانی قوتابخانە دەدەم



بەئەدەبەوە پرسیاری لێ دەکەم و وەڵام دەدەمەوە

### هەڵسەنگاندن

**١ سێ نموونە بهێنەرەوە کە گوزاشت لە مافی مامۆستا بکات:**

١. کاتێک لە شوێنێک پێی گەشتم سڵاوی لێ دەکەم.

٢. ..................................................

٣. ..................................................

**٢ ئەمانە ڕەنگ دەکەم**

مامۆستاکەم خۆش دەوێت
چونکە فێری کردم
خوا پاداشتی خێری بداتەوە

# یەکەی هەشتەم: هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا

## ١ وانەی یەکەم: ئادابی (١)



١ لەکاتی گەشتنم بەخەڵکی ڕوخۆش دەبم.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ) واتە: بەڕوخۆش بوون بەرامبەر براکەت خێروچاکەت بۆ دەنووسرێت.



٢ کاتێك دەگەم بەبراکەم تەوقەی لەگەڵ دەکەم و سڵاوی لێ دەکەم.

السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ



٣ گوێ لە هاوڕێکانم دەگرم و قسەیان پێ نابڕم.



٥ پێشی کەسانی لە خۆم گەورەتر ناکەوم.

## چالاکی خێزانی

دایك و باوکی بەڕێز مانای ئەم فەرموودەیە بۆ منداڵەکەت شیبکەرەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (بەڕوخۆش بوون لەگەڵ براکەت خێروچاکەت بۆ دەنووسرێت)

## هەڵسەنگاندن

١ نیشانەی ( ✓ ) یان ( ✗ ) بۆ ئەم هەڵسوکەوتانە دادەنێم




٢ هێڵ بکێشە بەژێر ئەو دەستەواژەیەی کە ڕاست و جوانە:

- کاتێك دەگەم بەهاوڕێکەم:

أ سڵاوی لێ ناکەم ب بەڕویەکی خۆشەوە سڵاوی لێ دەکەم.

- ئەگەر خراپەیەکم بەرامبەر براکەم ئەنجامدا:

أ قسەی لەگەڵ ناکەم ب سڵاوی لێ دەکەم و داوای لێبوردنی لێ دەکەم.

- کاتێك پیاوێکی بەتەمەن دێتە ژوورەوە

أ لە شوێنی خۆم هەڵناسم ب هەڵدەسم و بەخێرهاتنی دەکەم و کە لە شوێنێکی گونجاو دابنیشێت.

# ٢ وانەی دووەم: ئادابی (٢)

## چالاکی ١

ئەم دەستەواژەیە بەوێنەی گونجاو دەگەیەنم

دڵسۆزم بۆ هاوڕێکانم



ئاینی ئیسلام هانمان دەدات بەهاوڕێیەتیکردنی کەسانی چاك

## هەڵسەنگاندن

### ١ هەڵوێستی جوان هەڵدەبژێرم

◂ کاتێك کەسێك قسەی ناشیرینی پێ وتم:

أ بەشێوەیەکی توند وەڵامی دەدەمەوە

ب ئامۆژگاری دەکەم و بەخراپی وەڵامی نادەمەوە

◂ کە بینیم قەرەباڵغی درووست دەبێت لە کاتی دەرچوون لە قوتابخانە

أ تێکەڵی قەرەباڵغی دەبم بۆ ئەوەی زوو دەربچم

ب چاوەڕێ دەکەم تاوەکو قەرەباڵغی نامێنێت پاشان دەردەچم.

# ٣ وانەی سێیەم: ئادابی (٣)

١ هەر کەسێك پێویستی بەیارمەتی بێت یارمەتی دەدەم



هاوکاری نەخۆش



هاوکاری نابینا

پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێت: (وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ)
واتە: خوا یارمەتی ئەو بەندەیە دەدات کە یارمەتی براکەی دەدات.

## چالاکی ١

ووتەیەکی جوان بۆ ئەم وێنەیە دەردەبڕم



پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:(مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ باللَّه وَالْيَوْمِ الْآخر فَلْيُكْرِمْ جارَهُ)
واتە: هەر کەسێك باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە باچاك بێت لەگەڵ دراوسێکانی.

٢ لەگەڵ دراوسێکانم چاك دەبم و بەهیچ شێوەیەك نابمە هۆکاری ئازاردانیان



٣ مافی موسڵمانە لەسەر موسڵمان لەکاتی نەخۆشی سەردانی بکات و دوعای خێری بۆ بکات.

## هەڵسەنگاندن

**١ هێڵ بەژێر وێنەی گونجاو دەکێشم**

• سەردانی نەخۆش دەکەم لەبەر:

- دڵی خۆش بکەم و دوعای خێری بۆ بکەم
- کاتەکەم بەسەربەرم

**٢ گونجاوی (أ) دەگەیەنم بەگونجاوی (ب)**

| أ | ب |
|---|---|
| سەردانی نەخۆش | خوا خۆشی ناوێت |
| گەڕان بەدوای نهێنی دراوسێ | مافە لەسەر موسڵمان |
| باشترین خەڵکی لەلای خوا | بەسوودترینیانە بۆ خەڵکی |

٣ ئەگەر ببینیت هاوڕێکەت شتێکی قورس دەباتە ژوورەوە هەڵوێستت چۆن دەبێت؟

## تایبەتمەندی کتێبەکە:

یەکەم: وانەکان بە شێوازێك دانراوە کە ببێتە یارمەتی دەرێکی باش بۆ مامۆستا کە بە هەمان شێوازی پرۆگرامی قوتابخانە وانەکان بڵێتەوە.

دووەم: ڕەچاوی ئاستی قوتابی کراوە کە بە شێوەی پلەبەندی بابەتی زانستی دانراوە.

سێیەم: لە وانەکان چالاکی و هەڵسەنگاندن دانراوە بۆ ئەوەی قوتابی لە میانەی وانەکەدا بەشدار بێت بەشێوەی کرداری.

چوارەم: ڕەچاوی ڕۆڵی خێزان کراوە کە هەندێك لەو وانانەی فێردەکرێت تەواوکەری ئەو فێربوونە لەماڵەوە ئەرکەکان جێبەجێ بکات بۆ ئەوەی پەیوەندی ماڵ و فێرگە درووست ببێت.




**ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان**

٠٧٧٣١٩٧٤٦٤٦ / ٠٧٥٠١٥٧١٨١٨

1 571818 180004